ئیمامی إبن القیم ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت :

کاتێک موسا ( سەلامی الله ـی لێ بێت ) سەفەری کرد بۆلای خضر ، لە ڕێگادا هەستی بە برسیەتی و هیلاکەتی و ماندووبونێکی زۆر کرد ، لەوکاتەدا موسا بەو هاوەڵەی لەگەڵیدا بوو پێی فەرموو :

{ آتِنَا غَدَاءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِنْ سَفَرِنَا هَذَا نَصَباً }

واتە : ( ئادەی خواردنەکەمان بهێنە ، چونکە بەڕاستی لەم سەفەرەماندا زۆر هیلاك و ماندوو بووین ) .

چونکە سەفەرکردنی بوو بۆلای بەندە و درووستکراوێک ...

بەڵام کاتێک پەروەردگاری پەیمانی لە موسا وەرگرت سی شەو وە بە دە شەوی تریش ماوەکەی تەواوکرد ، لەم ماوەیەدا هیچ خواردنێکی نەخوارد ، هیچیش هەستی بە برسیەتی و ماندوویی نەکرد ، چونکە ئەمەیان سەفەرکردنی بوو بۆلای پەروەردگارە بەرزەکەی ...

ئا بەم شێوەیەیە سەفەر و گەشت کردنی دڵ و ڕۆیشتنی بۆلای پەروەردگار ، کە هەرگیز تیایدا هەست بە نەگبەتی و هیلاکی و ماندوویی ناکات ، کە هەرگیز ئەمە نابینێتەوە لە سەفەرکردنی بۆلای هیچ مەخلوقێکی تر .

[ بدائع الفوائد : 203 / 3 ]

# پێشـەکی

**بسم الله الرحمن الرحيم ، الحمد لله مالك الملك يؤتي الملك من يشاء وينزع الملك ممن يشاء ويعز من يشاء ويذل من يشاء بيده الخير إنه على كل شيء قدير، والصلاة والسلام على النبي المبين الذي تركنا على المحجة البيضاء ليلها كنهارها لا يزيغ عنها بعده إلا هالك ، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله ، صلى الله عليه وعلى آله وأصحابه ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين ، أما بعد :-**

پەرستش و عیبادەتەکان بەبێ بوونی أخلاق و ڕەوشت سوود بە خاوەنەکەی ناگەیەنێت:-

ئایا دەزانیت کێ موفلیس و مایە پووچە ، موفلیس و مایە پووچ ئەوکەسەیە کە شکستی هێناوە بەهۆکاری ( ڕەفتارو مامەڵەکان) نەوەک بەهۆکاری ( عیبادەتەکان ) ! !

رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) وەصفی موفلیسی کردووە بەوەی کەوا :

لە ڕۆژی قیامەت دێت بە

ئەنجام دانی نوێژەوە ( **عیبادەت** )

وە بە بەڕۆژوو بوونەوە ( **عیبادەت** )

وە بە بەخشینی زەکاتەوە ( **عیبادەت** )

تێبینی : ئەو موفلیس و مایە پووچە پلەی * سەرکەوتن / تێپەڕ بوون * لە تاقی کردنەوەی بەندایەتی و عیبادەتەکان بەدەست دەهێنێت...!!

بەڵام ئەی چی دەربارەی * ڕەفتار و مامەڵەکان * ، ئەی چی دەربارەی * ڕەوشت و هەڵسوکەوت * ؟؟؟

بۆ وەڵامی ئەمە سەیری بەشەکەی تری فەرموودەکە بکە:

وە دێت کەوا:

جنێوی بەم داوە ( **ڕەفتاروو مامەڵەکان** )

وە پارە و ماڵی ئەوی خواردووە ( **ڕەفتاروو مامەڵەکان** )

وە لەمەی داوە ( ڕەفتار و مامەڵەکان )

جا لە کۆتایی فەرموودەکە فەرمووی :

**چاکەکانی دەدرێت بەم وە ئەو چاکانەشی دەدرێت بەوی تر.....**
**پاشان هەڵدەدرێتە ناو ئاگرەوە!!**

بینیت کە * شکست هێنانی * لە ڕەفتار و مامەڵەکانیدا ئەو سەرکەوتنەی لە پەرستش و عیبادەتەکان بەدەستی هێنابوو لەناوی برد و کۆتایی پێ هێنا !!!

وە لە ئەنجامی کۆتاییدا ؟

* شکست خواردوو و سەرنەکەوتووەکان * = هەڵدەدرێنە ناو ئاگرەوە!!!

لە بەرامبەردا دەبینیت کە ئەو کەسەی خاوەن ڕەوشتێکی جوانە ( **لە ڕەفتار و مامەڵەکان** ) ، دەیبینیت کە گەیشتووەتە ئەو پلەیەی کە بە ڕۆژ بەڕۆژووە و بە شەویش شەونوێژ دەکات ( **بەندایەتی و عیبادەتەکان** ) بەهۆکاری ڕەوشت جوانی سەیری ئەم فەرموودەیە بکە:

( إن المؤمن ليدرك بحسن خلقه درجة الصائم القائم )

( بەڕاستی مرۆڤی بڕوادار بە ڕەوشت جوانیەکەی دەگاتە پلەی ئەو کەسەی کە بە ڕۆژ بەڕۆژووە و بە شەویش شەونوێژ دەکات )

ئەمەش لەبەرئەوەی کە شەعائیر و درووشمەکان ( عیبادەتەکان ) جێگیر نابێت بەبێ ڕەوشت جوانی ، وە ئەو شەعائیرانەش ئەگەر * ڕەوشتێکی * چاک و جوانی بەرهەم نەهێنا ئەوا مرۆڤ لەسەریەتی کە بە نەفسی خۆیدا بچێتەوە...

سەیربکە چۆن قورئان و سوننەت نێوانی * بەندایەتی و عیبادەتەکان * و ڕەوشت جوانی بەیەکەوە بەستاوەتەوە :-

نوێژ کردن : { إن الصلاة تنهى عن الفحشاء و المنكر }

واتە : بەڕاستی نوێژ بەرهەڵستی لە گوناه و تاوان و نادرووستی دەکات . ( ڕەوشت و هەڵسوکەوتی بەرهەم هێنا )

زەکات دان : { تطهرهم و تزكيهم بها }

واتە : دەبێتە هۆی خاوێن کردنەوەی ماڵەکانیان و پاککردنەوەی دڵ و دەروونیان . ( پاک و خاوێنی نەفس و تەزکیەی بەرهەم هێنا )

ڕۆژوو گرتن : ( من لم يدع قول الزور و العمل به ، فليس لله حاجة في أن يدع طعامه و شرابه )

واتە : هەرکەسێک واز نەهێنێت لە قسەی درۆ و کردەوەی خراپ ، ئەوا الله تعالی هیچ پێویستی بەوە نییە واز لە خواردن و خواردنەوە بهێنێت .

جا پەند و عیبرەت بە برسیەتی و تینوویەتی نییە بەڵکو بەوەی کە ڕەوشت جوانی بەرهەم بهێنێت.

حەج کردن : { فلا رفث و لا فسوق و لاجدال في الحج }

واتە : نزیکی هاوسەری نەکەوێت و شەڕە چەپۆک و گوناهو موجادەلە و گوفتاری نادروست ئەنجام نەدات.

بەڵێ هەموو بەندایەتی و عیبادەتەکان ڕەوشت جوانی و ڕەفتار و هەڵسوکەوتێکی چاک و درووست * بەرهەم دەهێنێت *...

**لە کۆتایدا:-**

(هیچ شتێک نییە قورستر بێت لە ڕەوشت جوانی لە تای تەرازووی مرۆڤی ئیمانداردا لە ڕۆژی قیامەتدا )

**اللهم ارزقنا حُسن الخُلق لا يرزق حُسنها إلا أنت واصرف عنا سوء الخُلق لايصرف سيئها إلا أنت ؛ وما أبريء نفسي أن النفس لأمارة بالسوء ألا ما رحم ربي أن ربي غفور رحيم.**



ئەم نامیلکەیەی ژێر دەستت مشتێکە لە
خەرمانی ووتەی پێشەوایان کە زۆربەی
لە ووتەی پێشەوایانی سەلەف
پێکهاتووە ؛ دەربارەی :
. ئیخڵاص و نیەت پاکی
. تێکەڵاویەتی لەگەڵ خەڵکیدا
. دڵ
. ناسیـنـی نەفـس



**بسم الله الرحمن الرحيم**

**الحمدلله وحده ، والصلاة والسلام على من لا نبي بعده ،**

**أما بعد :**

## { بەشی یەکەم دەربارەی : ئیخلاص و نیەت پاکی }

### 1- ئیمامی عومەر نوسراوێکی بۆ أبو موسا نووسی ( الله تعالی لە هەردووکیان ڕازی بێت ) کە تێیدا فەرمووی :

هەرکەسێک نیەتی بۆ الله تعالی پاک بکاتەوە ئەوا الله سبحانە وتعالی بێ پێویستی دەکات لە هەموو ئەم شتانەی کە لەنێوان خۆی و لەنێوانی خەڵکیە ، وە هەرکەسێک لە دڵیدا خۆی جوان بکات و بڕازێنێتەوە بۆ خەڵکی بە شتێک کە تەنها الله تعالی پێی دەزانێت ئەوا الله تعالی عەیبدار و ناشیرینی دەکات ، جا چ گومانێکت هەیە لە پاداشتی الله تعالی لە خێرا گەیاندنی ڕزق و ڕۆزیەکەی و گەنجینەکانی رەحمەت و میهرەبانی خۆی ، والسلام.

{ سنن الدارقطني ( ٥/٣٦٩ ) ، الزهد لهناد بن السري ( ٢/٤٣٦ ) }

## 2- مدرك كوڕی عوف الأحمسي دەفەرموێت :

کاتێک من لەلای ئیمامی عومەر بووم ( الله لێی ڕازی بێت ) لەوکاتەدا نێردراوێکی النعمان ی کوڕی مقرن هاتە لای ، ئیمامی عومەریش پرسیاری لێ دەکرد دەربارەی خەڵکی ، پیاوەکەش باسی ئەو کەسانەی دەکرد کە لە ڕۆژی جەنگی ( نهاوند ) پێکێنرابوون لە خەڵکی ، جا دەیگوت : فوڵانی کوڕی فوڵان و فوڵانی کوڕی فوڵان پێکێنراون ، پاشان نێردراوەکە گوتی : بەڵام هەندێک کەسی تریش هەیە ئێمە نایانناسین ، ئیمامی عومەریش فەرمووی : بەڵام الله سبحانه وتعالى دەیانناسێت .

- وە لە دەربڕینێکی تر هاتووە : ئیمامی عومەر ( الله لێی ڕازی بێت ) فەرمووی : بەڵام ئەو الله یەی کە ڕێزداریانی کردووە بە پلەی

شەهیدی ئەوا ڕووخساریان و نەسەب و کەسو کاریشیان دەناسێت.
{ الخراج لأبي يوسف ( ٣٥ ) }

3- سەعدی کوڕی أبی وەقاص بە سەلمانی فەرموو ( الله تعالى لە هەردووکیان ڕازی بێت ) ئامۆژگاریم بکە ، ئەویش فەرمووی :
بە إخلاص و نیەت پاکیەوە لەگەڵ حەق و ڕاستی بە ئەوا دەبیتە کەسێکی خالص و نیەت پاک ( واتە : سەرکەوتوو و سەرفراز دەبیت ) .
{ بهجة المجالس ( ٢/٥٨٥ ) }

4- إبن الجوزی ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت :
کارو کردەوە وێنە و شێوەیە ، وە ئیخلاص یش ڕووحەکەیەتی ، بۆیە ئەگەر کارو کردەوەکانت بە ئیخلاص و نیەت پاکیەوە نەبوو

ئەوا خۆت ماندوو مەکە ، چونکە ڕاگری و ڕاوەستاوی بۆ لاشە نییە بەبێ ڕوح و گیان .
{ المدهش ( ١/٤١٨ ) }

5- بە سهل ی التُّستري گوترا :
چ شتێک زەحمەتتر و نارەحەتترە لەسەر نەفس ؟ ئەویش فەرمووی : ئیخلاص و نیەت پاکی ، چونکە لە ئیخلاص و نیەت پاکیدا هیچ پشک و بەشێکی بۆ هیچ کەسێکی تر تێدا نییە.
[ ( الرسالة القشيرية ( ٢/٣٦١ ) ]

6- مُطرّف کوڕی عبدالله ( ڕەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت :
چاکی و سەلامەتی کارو کردەوە بەهۆی چاکی و باشی و سەلامەتی دڵەوەیە ، وە چاکی و سەلامەتی دڵیش بەهۆی چاکی و سەلامەتی نیەتەوەیە ، وە هەرکەسێک ( نیەتەکەی ) پاک و بێگەرد بوو ئەوا ( کارو کردەوەکەشی ) بۆ پاک و پوخت دەبێت ، وە

هەرکەسێکیش ( نیەتەکەی ) شتی تری تێکەڵ کرد ئەوا لێی تێکەڵ دەبێت و تێکدەچێت.
[ ( حلية الأولياء ( ١٩٩/ ٢ ) ]

7- سوفیانی ثەوری ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت:
هیچ شتێکم چارەسەر نەکردووە سەختتر و گرانتر بێت لەسەرم لە پاککردنەوەی نیەتم بۆ الله تعالی ، چونکە بەڕاستی زۆر جار نیەتم دەگۆڕا و وەک خۆی نەدەما.
[ ( الجامع لأخلاق الراوي ( ٣١٧ ) ]

8- ڕۆژێکیان حەسەنی بەصری ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد ، پیاوێکیش لە شوێنەکەدا دای لە پرمەی گریان ، پێشەوا حەسەنیش فەرمووی:
بەڕاستی الله سبحانه وتعالی لە ڕۆژی قیامەتدا پرسیارت لێ دەکات کە ئایا لەمەدا مەبەستت چی بوو (واتە : پرسیارت لێ

دەكات كە ئایا ئەم گریانەت لە ترسی ئەو بووە یان بۆ خۆدەرخستن بووە ).
[ ( الإخلاص والنية لابن أبي الدنيا ( ٥٥ )]

9- أبو سليمان ى الداراني ( ڕەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت :

هیچ كردەوەیەكی خۆمم ئەوەندە بە باش دانەناوە كە بڵێم نەجاتم دەبێت پێی و حسابی بۆ بكەم.
[ ( الرسالة القشيرية ( ١/٢٢٠ )]

10- إبن الجوزی ( ڕەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت:

ڕاستگۆیی بۆ داواكردنی ڕەزامەندی الله دا هۆكاری ئەوەیە ڕێگای ڕاستت بۆ ڕۆشن بێتەوە ، هەركات ڕاستگۆیت هەبوو ئەوا الله تعالی هیدایەتت دەدات بۆ ڕێگای ڕاست ، بەڵام ئەو كەسەی نیەت پاك و دڵسۆز نەبێت و ڕاست نەكات ئەوە دەكەوێت و ناتوانێت بەردەوام بێت.

[ ( صيد الخاطر ( ٣٤٣ ) ]

## 11- إبن الجوزي ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت:

چەندە کەمە هاوشێوەی ئەو کەسەی کە بە إخلاص و نیەت پاکیەوە کارو کردەوە بۆ الله تعالى دەکات ، چونکە بەڕاستی زۆربەی خەڵکی حەز بە دەرخستنی عیبادەتەکانیان دەکەن.

وە سوفیانی ثەوری دەیفەرموو : حسابم بۆ نەکردووە و ئاوڕم نەداوەتەوە بەلای ئەو کردەوانەی کە خەڵکی بینیویانە و دەرکەوتووە.

وە بزانە کە وازهێنانی سەیرکردن بەلای درووست کراوەکان ، وە سڕینەوەی ڕێز و پلەو پایە لە دڵیان بەهۆی مامەڵە کردنەوە ، وە بە مەبەستی ئیخلاص و نیەت پاکی بێت ، و داپۆشینی حاڵی بێت ، ئەمە بەرزکردنەوەی کەسێکی بەرزە.

[( صيد الخاطر ( ٢٤٢ )]

## 12- أبو التّيّاح ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت:

پیاوی وا هەبوو کە بیست ساڵ بوو عیبادەت و پەرستشی الله تعالی ی دەکرد کەچی دراوسێکەی پێی نەدەزانی.

[ ( الإخلاص والنّية لابن أبي الدنيا ( ٦٣ ) ]

13.ڕەبیعی کوڕی خەیثەم ( ڕەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت :

هەموو کارو کردەوەیەک ئەگەر مەبەست پێی بۆ گەیشتن نەبێت بەڕووخساری الله تعالی ئەوا ئەو کردەوەیە لەناو دەچێت و دەفەوتێت.

[ ( طبقات ابن سعد ( ٢/٦٦ ) ]

14- بەکری کوڕی عبدالله ( ڕەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت :

بەڕاستی أبو بەکر چاکترینی خەڵکی نەبوو بەهۆی ئەوەی کە لە هەموویان زیاتر نوێژ و ڕۆژووی هەبێت ، بەڵکو چاکە و فەزڵی أبو

بەکر بەسەریان بەهۆی ئەو شتەوە بوو کە لە دڵیدا هەبوو ( واتە : ئیخلاص و نیەت پاکیەکەی ) .
( فضائل الصحابة للإمام أحمد ( ١٤١ ) / الزاهد لأبي داود ( ٥٩)

### 15. ئیبڕاهیم ی الخواص ( ڕەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت :

هەست کردن بە چاودێری کردن بریتییە لە : دڵسۆز بوون و بە ئیخڵاص بوون بۆ الله عز وجل لە نهێنی و ئاشکراییدا.
[ ( مدارج السالكين ( ٢/٦٦ )]

### 16. بە سوفیانی ثەوری گوترا :

کارو کردەوەی چاکە چییە ؟ ئەویش فەرمووی : کارو کردەوەی چاکە ئەوەیە کە تۆ هەرگیز حەز نەکەیت و پێت خۆش نەبێت کە هیچ کەسێک لەسەر ئەنجامدانی سوپاست بکات.
[ ( بهجة المجالس ( ٣٤٤/ ٣ )]

17. سوفیانی ثەوری ( رەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت:

ئاممان خۆت بپارێزە و دوور بكەرەوە لەو شتەی كە كارو كردەوەكانت هەڵدەوەشێنێتەوە ، چونكە بەڕاستی ڕیاء و بەرچاوی كارو كردەوەكەت هەڵدەوەشێنێتەوە.

[ ( موارد الظمآن ( ٤/١٢٠ )]

18. سەهل ی التُّستري ( رەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت:

هیچ كەسێک ڕیاء ناناسێت تەنها كەسی موخلیص و دڵسۆز و نیەت پاک نەبێت.

[ ( شعب الإيمان ( ٩/١٨٨ )]

19. ئیمامی شافعی ( رەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت:

هەرشتێک كە لەنێو دڵم دا هەیە لەو علم و زانستەی كە هەمە ئیللا ئاواتە خوازم كەوا بگاتە لای هەموو كەسێک وە لەپاشانیشدا هیچ كەسێک ئەو علمە نەگەڕێنێتەوە بۆلای من و نەیداتە پاڵ من.

[ ( آداب الشافعي ومناقبه ( ٦٨ )]

20. إبن الجوزي ( رەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت:

هەرکاتێک ئەو کەسەی کارو کردەوە دەکات سەیری ئاوڕدانەوەی دڵی خەڵکی کرد بۆلای خۆی ئەوا شیرک فشار دەخاتە سەر نیەتەکەی و زۆری بۆ دەهێنێت ، چونکە پێویستە تەنها ڕازی بێت بە سەیرکردنی ئەوەی کارو کردەوەی بۆ ئەنجام دەدات ( کە الله یە ).

وە لە پێویستیەکانی ئیخلاص و نیەت پاکیە کە : نابێت مەبەستی ئاوڕدانەوەی دڵی خەڵکی بێت بۆلای خۆی جا ئەمەش ڕوودەدات نەوەک بەهۆی مەبەستەکەی ، بەڵکو دەبێت بەهۆی ڕق لێبوونەوەی بێت لەمە.

[ ( صيد الخاطر ( ٣٤٩-٣٥٠ )]

21. ئیمامی إبن القيم ( رەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت:

هەرگیز ئیخڵاص و نیەت پاکی لەگەڵ حەزکردن بە مەدح و ستایش کردن و پیاهەڵدان و چاو تێبڕین لەلای خەڵکی لە دڵێکدا کۆنابێتەوە ، هەروەکو چۆن ئاو و ئاگر وە هەروەها مارمێلکە و نەهەنگ بەیەکەوە کۆنابنەوە.

[ ( الفوائد ) ( ١٨٢ )]

22. لە حەسەنی بەصری یەوە هاتووە کەوا ڕۆژێکیان قسەی بۆ خەڵک دەکرد ، یان ئامۆژگاریانی دەکرد ، جا لە مەجلیسەکەیدا پیاوێک هەناسەی دەدا ( واتە : ناڵە و نکەی گریانی دەهات ) ، پێشەوا حەسەنیش فەرمووی : ئەگەر ئەمەت بۆ اللە بێت ئەوا خۆت دەرخست ، وە ئەگەر بۆ غەیری اللە شت بووبێت ئەوا خۆت بە هیلاک برد.

[ ( الإخلاص والنية لابن أبي الدنيا ) ( ٦٥ )]

23. مالک ی کوڕی دینار ( ڕەحمەتی اللە لێ بێت ) دەفەرموێت :

بەو کەسانەی کە ڕاستگۆ نەبوون ( واتە : لەگەڵ نیەتەکەیان ڕاستگۆ نەبوون ) پێیان بڵێن : خۆتان ماندوو مەکاااااان.
[ ( صفة الصفوة ( ٢/١٦٧ ) ]

24. إبن عبدالقوي ( ڕەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت:
بێگومان کۆڵەکە و پایەی دین ئیخڵاص و دڵسۆزیە لە نیەت دا وە ئەگەر ئیخڵاصت نەبێت لەو ماندوو بوونەدا دەست بەتاڵی.
[ ( الألفية في الآداب الشرعية ( ٧١ ) ]

*****************************************************

## { بەشی دووەم دەربارەی : تێکەڵاویەتی لەگەڵ خەڵکیدا }

### 1 - پیاوێک لەلای پێشەوا عومەر ( الله لێی ڕازی بێت ) شایەتیەکی دا:

پێشەوا عومەر فەرمووی : ناتناسم ، زیانی بۆت نیە کە من نەتناسم ، بەڵام کەسێک بهێنە بتناسێت.

پیاوێک لەناو خەڵکەکەدا بوو گوتی : من دەیناسم.

پێشەوا عومەر فەرمووی : بەچی دەیناسی ؟

پیاوەکە گوتی : بە دادپەروەری و عەقڵ و ژیریەکەی .

پێشەوا عومەر فەرمووی : ئایە ئەو کەسە دراوسێی خوار خۆتە کە شەو و ڕۆژ و هاتنە ناوە و چوونە دەرەوەی شارەزابیت ؟

پیاوەکە گوتی : نەخێر.

پێشەوا عومەر فەرمووی : مامەڵەی دینار و درهەمت لەگەڵ کردووە تا بەهۆیانەوە وەرعی ئەو شارەزابیت ؟

پیاوەکە گوتی : نەخێر

پێشەوا عومەر فەرمووی : هاوڕێت بووە لە سەفەردا کە لەوێدا ڕەوشت بەرزیت بۆ دەرکەوتبێت ؟

پیاوەکە گوتی : نەخێر.

پێشەوا عومەر فەرمووی : کەواتە نایناسیت ، پاشان بە کابرای شایەتی گوت : کەسێک بهێنە کە بتناسێت.

[ ( الجد الحثيث ) ( ٤٥ )]

2- عبدالله ی کوڕی مەسعود ( الله لێی ڕازی بێت ) دەفەرموێت:

با مرۆڤ نەفسی خۆی ڕا بهێنێت لەسەر ئەوەی کە ئەگەر هەرچی مرۆڤ هەیە لە زەویدا گشتیان کافر بوون و بێ باوەڕ بوونەوە ئەوا با ئەو کافر نەبێت و بێ باوەڕ نەبێتەوە ، وە با هیچ یەکێک لەئێوە کەسێکی چاولێکەر ( إمعة ) نەبێت ،

گوترا : چاولێکەری ( إمعة ) چییە ؟

ئەویش فەرمووی : ئەمە ئەو کەسەیە کە بەردەوام دەڵێت : من هەر لەگەڵ خەڵکیدامە ، وە ئەو با نەبێتە پێشەنگ و ڕابەر لە شەڕ و خراپەدا.

[ ( حلية الأولياء ( ١/١٣٧ )]

3- لە عائیشەوە ( اللە لێی ڕازی بێت ) فەرموویەتی:
بەڕاستی ئێوە غافڵ و بێ ئاگان لە باشترین عیبادەت کە ئەویش تەواضع و خۆ بەکەم زانینە.
[ ( الزهد لأبي داود ( ٢٨٦ )]

4- عبداللە ی کوڕی مەسعود ( اللە لێی ڕازی بێت ) دەفەرموێت:
بێگومان لە تەواضع و خۆ بەکەم زانینەوەیە کە ڕازی بیت بچیت لە خوارەوەی مەجلیس دابنیشیت ، وە هەروەها سەلامیش بکەیت لە هەرکەسێک کە پێی گەیشتیت.
[ ( الآداب الشرعية ( ٢/٢٠٩ )]

5- عومەری کوڕی خەطاب ( اللە لێی ڕازی بێت ) دەفەرموێت:
قسە مەکە سەبارەت بە شتێک پەیوەندی بە تۆوە نییە ، وە دوورە پەرێز بە لە دوژمنەکەت ، وە وریابە لە برادەرەکەت ئیللا

برادەری ئەمینی دڵ و دەست و زمان و دامێن پاک نەبێت ، وە کەسیش ئەمین نییە ئیللا کەسێک نەبێت کە لە اللہ دەترسێت و گوێڕایەڵی دەکات ، وە لەگەڵ خراپەکاردا ڕێ مەکە چونکە فێری خراپەکارییەکانی خۆیت دەکات ، وە نهێنیەکانی خۆتی بۆ ئاشکرا مەکە و دەریمەبڕە بۆی ، وە لە ئیش و کارەکانتدا پرس و ڕا بە کەس مەکە ئیللا بەوانە نەبێت کەوا لە اللہ دەترسن.

[ ( کتاب العزلة ( ١٤٤ ) ]

6 - عومەری کوڕی خەطاب ( اللہ لێی ڕازی بێت ) دەفەرموێت:

بێگومان لەو شتانەی کە خۆشەویستی بۆ براکەت پاک دەکاتەوە لە هەموو شتێک ئەوەیە کە : ئەگەر پێی گەیشتی لە سەرەتادا سەلامی لێ بکە و دەست پێشخەربە لە سەلام لێ کردنی ، وە هەروەها بانگی بکە بە خۆشترینی ئەو ناوانەی کە خۆی حەزی پێیەتی ، وە هەروەها لە مەجلیسدا جێگای بۆ فراوان بکە و جێگای بۆ بکەرەوە.

[ ( بهجة المجالس ( ١/٤٣ ) ]

7- لە عبداللە ی کوڕی عەباس ەوە ( اللە لەخۆی و باوکی ڕازی بێت ) کە فەرموویەتی:

من زۆر پێم ناخۆشە کەوا پیاوێک سێ جار بێتە سەر بەڕەی ماڵەکەم و شوێن دەستم دیار نەبێت لە خزمەت کردنی.

[ ( بهجة المجالس ( ١/٤٦ ) ]

8 - لە أبو الدرداء ەوە ( اللە لێی ڕازی بێت ) فەرموویەتی:

هەرکەسێک ( بەدوای براکانی و ئەحواڵیان ) نەپرسێت وون دەبێت ، وە هەرکەسێک ئارامی و صەبر ئامادەنەکات بۆ کارەساتەکان ئەوا بێ توانا ئەکەوێت .

[ ( الزهد لأبي داود ( ١٩٦ ) ]

9 - إبن مبارک ( ڕەحمەتی اللە لێی بێت ) دەفەرموێت:

خۆ بە عیززەت کردن و خۆ ڕێزدار کردن بەسەر دەوڵەمەندەکان تەواضع و خۆ بەکەم زانینە.

[ ( بهجة المجالس ( ٢/٤٤٦ ) ]

10 - عبد الملك ی کوڕی مەڕوان ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت:

چاکترینی خەڵکی ئەو کەسەیە کە تەواضع ی هەیە و خۆی بە کەم دەزانێت لەکاتی بەرزی و هەبوونی پلەو پایەدا ، وە هەروەها زاهید بێت لەکاتی هەبوونی قودرەت و توانادا ، وە عەدالەت و دادپەروەر بێت لەکاتی هەبوونی هێز و قوەتدا . ( زاهید واتە : واز لە هەموو ئەم کارانەی دونیا بهێنێت کە سوودی بۆ قیامەتی نییە )

[ ( شعب الإيمان ( ١٠/٥٠٠ ) ]

11. بە إبن مبارک گوترا : چارەسەر و دەرمانی دڵ چییە ؟

ئەویش فەرمووی : کەم کردنەوەی چاو پێکەوتنە لەگەڵ خەڵکیدا.

[ ( الرسالة القشيرية ( ١/٢٢٦ ) ]

12. ڕەجائی کوڕی حەیوە ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت :

هەرکەسێک برادەرایەتی کەس نەکات تەنها برادەرایەتی ئەو کەسە بکات کە هیچ عەیبێکی تێدا نییە ئەوا هاوڕێی کەم دەبێت ، وە هەرکەسێک ڕازی نەبێت لە هاوڕێکەی تەنها بە ئیخلاص نەبێت ئەوا بەردەوام بە توڕەیی دەمێنێتەوە لێی ، وە هەرکەسێک گلەیی و ڕەخنە لە برادەرەکانی بگرێت لەسەر هەموو تاوانێک ئەوا دوژمنی زۆر دەبێت.

[ ( تاريخ دمشق ( ١٠٥/١٨ ) ]

13. عبدالله ی کوڕی المعتز دەفەرموێت:

چاکە کردن لەگەڵت کۆتوبەندێکە ، هیچ شتێک نایکاتەوە مەگەر سوپاس کردن یان پاداشت دانەوە نەبێت.

وە هەروەها فەرموویەتی:

چاکە کردن کۆیلایەتییە ، پاداشتەکەشی ئازاد کردنە.

[ ( الوافي بالوافيات ( ٢٤٢/١٧ ) ]

14. حەسەنی بەصری ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) فەرموویەتی:

واللە بێگومان ئەگەر تۆ هاوڕێیەتی کۆمەڵە کەسێک بکەیت بەردەوام بتترسێنن هەتاوەکو هەست بە ئەمن و سەلامەتی دەکەیت زۆر چاکترە بۆت لەوەی کە هاوڕێیەتی کەسانێک بکەیت ئەمان و سەلامەتیت پێ بدەن هەتاوەکو دەگەیتە مەترسیەتی.!

[ ( الزهد لابن المبارك ( ١٠٢ )]

15. کاتێک حاتەم ی ئەصەم ی هاتە لای ئیمامی أحمد ،

ئیمامی أحمدیش لەدوای زەردەخەنە کردنی بۆی پێی فەرموو : هەواڵم پێ بدە چۆن ڕزگارت دەبێت لە سەلامەت بوون لە خەڵکی ؟

حاتەم پێی فەرموو : بە سێ شت ،

ئیمامی أحمدیش پێی فەرموو : چین ئەم شتانە ؟

فەرمووی : پێیان بدەیت و لێیان وەرنەگری ، وە بەرژەوەندیەکانیان جێبەجێ بکەیت و داوای بەجێ گەیاندنی

بەرژەوەندیەکانی خۆشت لێیان نەکەیت ، وە ئارام بگریت کاتێک ئازارت دەدەن وە تۆش ئەزیەتیان نەدەیت ،
.ئیمامی أحمدیش فەرمووی : بەڕاستی زۆر قورسە!..
حاتەم یش پێی فەرموو : خۆزگە لەگەڵ ئەوەشدا سەلامەت دەبوویت !..
[ ( عین الأدب والسیاسة ( ١٥٥ )]

## 16. فوضەیلی کوڕی عەیاض ( ڕەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت:

بەڕاستی پچڕاندنی پەیوەندی لەگەڵ خەڵکیدا بەهۆی تەکەلوف و تێچوونەوەیە ، کەسێکیان سەردانی ئەوی تریان دەکات قورس دەخاتە سەرشانی بە خزمەت کردنی ، بۆیە ئەوەش دەبێتە هۆی دابڕینی سەردانی کردنی بۆی.
[ ( قوت القلوب ( ٢/٣٠٩ )]

**************************************************

## {بەشی سێیەم دەربارەی : دڵ}

1.عبداللە ی کوڕی مەسعود ( اللە لێی ڕازی بێت ) دەفەرموێت :

« بەڕاستی دڵ کاتی هەیە چالاکە و ئارەزووی وەرگرتنی هەیە ، وە کاتیش هەیە سارد و کەمتەرخەمە و حەزی وەرگرتنی نیە ، ئێوە دەرفەتی حەز و چالاکیەکەی بقۆزنەوە ، وە کاتی بێتاقەتی و بێزاریەکەی وازی لێ بهێنن ».

[ الجامع لأخلاق الراوي - ١/٣٣١ ]

2.لە سەلمان ەوە ( اللە لێی ڕازی بێت ) فەرموویەتی:

« بۆ هەموو مرۆڤێک نهێنی و ئاشکرایی هەیە ، جا هەرکەسێک نادیار و نهێنیەکانی چاک بێت ئەوا اللە تعالی ڕووکەش و ئاشکراکانی چاک دەکات ، وە هەرکەسێک نهێنی و نادیارەکانی خراپ بێت ئەوا اللە تعالی ڕووکەش و ئاشکراکانی خراپ دەکات ».

[ ( الزهد لأبي داود ( ٢٣٥ ) ]

3. له أبو دەرداء ەوه ( الله لێی ڕازی بێت ) فەرموویەتی :
» خودایه من پەنات پێ دەگرم له پەرتەوازەیی دڵ ، وه ئەم پەرتەوازەییەش ئەوەیه که له هەموو دۆڵێکدا ماڵ و سامانێکم هەبێت .«
[ ( الزهد لأبي داود ( ٢٠٦ ) ]

4. « پیاوێک هاته لای دایکی دەرداء ، گوتی : بەڕاستی من دەرد و نەخۆشیەکم هەیه که له گەورەترینی دەردەکانه ، جا ئایا دەبێت چارەسەر و دەرمانی هەبێت ؟
أم دەرداء فەرمووی : ئەم دەردە چییه که هەته ؟
پیاوەکه گوتی : من دەبینم کەوا دڵم زۆر ڕەق بووه.
أم دەرداء فەرمووی : بەڕاستی گەورەترین دەرد و نەخۆشی ئەم دەردەی تۆیه : بۆیه سەردانی نەخۆش بکه ، وه شوێنی مردوو

بکەوە ، وە هەروەها سەردانی گۆڕستان بکە ، لەوانەیە الله تعالی دڵت نەرم بکات ،
گوتی : پیاوەکەش ئەم کارانەی ئەنجام دا ، جا دوای ئەوەی کەوا پیاوەکە لە نەفسی خۆیدا هەستی بە نەرمی دڵی دەکرد ، ئینجا هاتەوە بۆلای أم دەرداء و سوپاسی کرد .»
[ ( الزهد لأبي داود ( ١٩٧-١٩٦ ]

### 5. مالک ی کوڕی دینار ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت:

هیچ سزایەک دانەنراوە بۆ سەر بەندە گەورەتر و قورستر بێت لە دڵ ڕەق بوون.
[ مجموع رسائل ابن رجب ( ١/ ٢٦٠ )

### 6. فوضەیلی کوڕی عەیاض ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت:

دوو شت هەیە کە دڵ ڕەق دەکات : زۆر قسە کردن ، وە زۆر خواردن.

[ ( روضة العقلاء ونزهة الفضلاء ( ٤٣ )]

7. ئیبراهیم ی خەواص ( ڕەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت:

دەرمان و چارەسەری دڵ لە پێنج شتان دا هەیە:

خوێندنەوەی قورئان بە تێگەیشتن و تێڕامانەوە ، وە بەتاڵ بوونی گەدە ، وە شەو نوێژ کردن ، وە پاڕانەوە و لاڵانەوە لەکاتی سەحەری بەرەبەیان ، وە دانیشتن لە مەجلیسی صالح و پیاوچاکان.

[ ( ذم الهوى ٧٠]

8. إبن القیم ( ڕەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت:

بەڕاستی لەکاتی دڵ ڕەق بوون دا هیچ شتێک نایتوێنێتەوە تەنها زیکر و یادکردنی الله تعالى نەبێت ، جا پێویستە کەوا بەندە چارەسەری دڵ ڕەقیەکەی بکات بە زیکر و یادی الله تعالى.

وە حەمماد ی کوڕی زەید گێڕاویەتیەوە لە المعلى کوڕی زیاد کە پیاوێک بە پێشەوا حەسەنی بەصری گوت : ئەی باوکی سەعید

سکاڵای دڵ ڕەقی خۆم بۆ لای تۆ دێنم و باس دەکەم ! ، ئەویش فەرمووی : بیتوێنەوە بە زیکر و یادی الله سبحانە وتعالى.

وە ئەمەش لەبەر ئەمەیە کەوا دڵ هەرکاتێک لە غەفڵەت و بێ ئاگاییەکی زۆر دابوو‌بێت ئەوا بەهۆی ئەم بێ ئاگاییەوە دڵیشی زۆر ڕەق دەبێت ، جا کەواتە زیکر و یادی الله تعالی ئەو ڕەقیە دەتوێنێتەوە هەروەکو چۆن قوڕقوشم لەنێو ئاگردا دەتوێتەوە ، جا هیچ شتێک دڵە ڕەقەکان ناتوێنێتەوە بەهاوشێوەی زیکر و یادی الله عزوجل.

[ ( الوابل الصيِّب ( ٩٩ )]

9. پیاوێک لەلای ئیبراهیم ی کوڕی ئەدهەم وەستا ، گوتی:

ئەی باوکی ئیسحاق بۆچی دڵەکان داپۆشراون لە یاد و زیکری الله تعالى ؟

ئەویش فەرمووی : لەبەرئەوەی دڵ ئەو شتەی خۆش دەوێت و حەزی پێ دەکات کە الله تعالى ڕقی لێ دەبێتەوە ، دونیای خۆش دەوێت و حەز بە ماڵی دونیای فریودەر و لەهو و یاری و گەمە

دەکات ، وە واز دەهێنێت لە کار کردن بۆ ئەو ماڵەی کە ژیانی هەتا هەتایی هەرلەوێیە.

[( الزهد للبيهقي ( ٢٧٦ )]

## 10. إبن القيم دەربارەی دڵ فەرموویەتی:

وە لە نیشانەکانی سەلامەتی دڵ ئەوەیە کەوا : ئەگەر فریای ویردەکەی نەکەوت و لە کیسی چوو ، ئەوا لەبەرلە کیس چوونی ویردەکە غەم و ئازارێکی بۆ درووست دەبێت کە گەورەترە لە سوور بوونی غەم و ئازار بینین بەهۆی لەکیس چوون و وون بوونی ماڵ و سامانەکەی.

[( إغاثة اللهفان ( ١/١٤٧ )]

## 11. إبن القيم ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت:

» چاک بوون و باش بوون بۆ دڵ و لاشە نییە تەنها بە دوورکەوتنەوە نەبێت لە گوناهە کەبائیر و گەورەکان ، ئەوانەی کە پەیوەندی بە دڵەوە هەیە وەک : ڕیاء و بەرچاوی ، وە عوجب

و سەرسام بوون بەخۆت ، وە خۆ بەگەورە زانین ، وە فەخر کردن بەسەرکەسانی تر ، وە لەخۆبایی بوون ، وە نا ئومێد بوون و بێ هیوا بوون لە رەحمەتی اللە ، وە دڵنیابوون و بێ باک بوون لە مەکر و هێزو دەسەڵات و سزای اللە ، وە دڵخۆش بوون و شادوومان بوون بە ئەزیەت و ئازاردنی موسلمانان ، وە دڵخۆش بوون بە تووش بوونیان بە بەڵا و موسیبەت ، وە حەزکردن بەوەی کە فاحیشە و زینا لەناویاندا بڵاوببێتەوە ، وە حەسوودی و بەخیلی بردن پێیان لەسەر ئەو فەزڵ و پلەیەی کە اللە پێیانی بەخشیوە ، وە ئاواتە خوازبوون لەسەر نەمانی ئەو فەزڵ و پلەو پایەی کە هەیانە ،

وە تەواوی ئەو کارو بارانە و ئەوەشی کە لەدوایەوە دێت لەوانەی کە پەیوەندی بە دڵ ـەوە هەیە ، ئەوا حەڕامیەتیەکەی زۆرزیاترە لە حەڕامیەتی زینا و ئارەق خواردنەوە ، وە جگە لەمانەش لە گوناهە ئاشکرایە گەورەکان ، وە پێویستە تەوبەی لێ بکات ، وە ئەگەر تەوبەی نەکرد ئەوا ئەو کەسە خاوەنی دڵێکی فاسد و

خراپ و بۆگەنە ، وە ئەگەر دڵیش فاسد و خراپ بوو ئەوا لاشەش فاسد و خراپ دەبێت.»
[ ( مدارج السالكين ( ١ / ١٣٣ )]

12. حەسەنی بەصری ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت:

» ئەگەر چاکی و باشی و سەلامەتی دڵ ـت دەوێت ئەوا داوای لێ بکە بەهۆی پارێزگاری کردنی ئەندامەکانی لاشەت .»
[ ( البداية والنهاية ( ١٠/٣٥٠ )]

13. إبن ڕەجەب ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت:

» چاکترینی خەڵکی ئەو کەسەیە کە ڕێگای پێغەمبەری گرتووەتە بەر ( صلى الله عليه وسلم ) وە بە تایبەتیش هاوەڵەکانی لە اقتصاد کردن لە عیبادەت لەڕووی لاشەوە ، وە اجتهاد و هەوڵ دانیش لە حاڵ و بارو دۆخەکان لەڕووی دڵ ـەوە ، چونکە سەفەری دوارۆژ دەپچڕێت بەهۆی ڕۆیشتنی دڵەکان نەوەک بەهۆی ڕۆیشتنی لاشەکان .»

[ ( المحجة في سير الدلجة ( ٥٦ )]

**14. عومەری کوڕی صالح ( ڕەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت :**

« پرسیارم لە باوکی عبدالله کرد ( واتە : ئیمامی أحمد ) بەچی دڵەکان نەرم دەبنەوە ؟
ئیمام أحمد سەیری کردم و لێی ڕوانیم پاشان دووبارە سەیری کردمەوە و لێی ڕوانیم دوای ماوەیەک ئینجا فەرمووی : بەچ شتێک ؟! بە خواردنی حەڵاڵ ».
[ ( طبقات الحنابلة ( ١/٢١٩ ) ]

**15. حەسّان ی کوڕی عەطیّة دەفەرموێت:**

« بەڕاستی جارهەیە دوو پیاو لە یەک نوێژدا بەیەکەوەن ، بەڵام نێوانی ئەو دوو پیاوە لە فەزڵ و پاداشت دا وەکو نێوانی ئاسمان و زەوی وایە ، وە ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە یەکێکیان بە دڵیەوە

ئامادەی نوێژەکەیە بۆ الله عزوجل ، وە کەسەکەی تریش دڵێکی بێ ئاگا و غافڵ ی هەیە لە نوێژەکەدا.»
[ ( الوابل الصيب ( ٣٤ )]

16. إبن ڕەجەب ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت:

« بەڕاستی بنچینە لە تەقوا و تاوان هۆکاری سەرەکیەکەی بریتییە لە دڵەکان ، جا ئەگەر دڵ چاک و گوێڕایەڵ و تەقوادار بوو ئەوا ئەندامەکانی لاشەش چاک و باش و گوێڕایەڵ دەبێت ، وە ئەگەر دڵ یش ڕۆچوو بوو لە سەرپێچی و تاوان دا ئەوا ئەندامەکانی لاشەش ڕۆدەچن لە تاوان و سەرپێچی ، هەروەکو چۆن پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : " تەقوا و ترسان لە الله ئا ئەلێرەیە ! " ، وە ئاماژەی بۆ سینگی موبارەکی کرد .»
[ ( جامع العلوم والحكم ( ١/٢٢٩ )]

## 17. مُطرِّف کوڕی عبدالله ( ڕەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت :

» چاکی و سەلامەتی کارو کردەوە بەهۆی چاکی و باشی و سەلامەتی دڵەوەیە ، وە چاکی و سەلامەتی دڵیش بەهۆی چاکی و سەلامەتی نیەتەوەیە ، وە هەرکەسێک ( نیەتەکەی ) پاک و بێگەرد بوو ئەوا ( کارو کردەوەکەشی ) بۆ پاک و پوخت دەبێت ، وە هەرکەسێکیش ( نیەتەکەی ) شتی تری تێکەڵ کرد ئەوا لێی تێکەڵ دەبێت و تێکدەچێت.«

[( حلیة الأولیاء ( ٢/١٩٩ )]

## 18. إبن عطیة ( ڕەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت:

« چاو گەورەترین دەرگایە بۆلای دڵ ، وە ئاوەدان کردنەوە و بە ئاگا هێنانی گشت ڕێگاکانی هەستیاری مرۆڤە بۆلای ئەو ، وە بە گوێرەی ئەمەشەوە کەوتن لە ئاستیدا زۆرترە ، وە هەروەها واجبە خۆپاراستن لێی .»

[( تفسیر ابن عطیة ( ٤/١٧٧ )]

## 19. إبن جەوزی ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت:

» سەرقاڵ بوون بە فیقهـ و گوێگرتن لە فەرموودەم بینی بەڵام بەس نەبوو بۆ چاک بوون و سەلامەت بوونی دڵ ، تەنها کاتێک کە تێکەڵ دەبیت بەو شتانەی کە دڵ نەرم دەکات وە هەروەها کاتێکیش کە سەیری ژیانی سەلەفی صالح دەکەیت.

وە بەڕاستی جار هەبووە کۆمەڵێک لە سەلەف دەچوونە لای عەبدێکی صالح و چاک بە مەبەستی سەیرکردنی سەکینەت و دەرکەوتنی دیمەنی موسلمانەتیەکەی لە سیمای وە هەروەها بۆ سەیرکردنی هیدایەت و ڕێنموویيەکەی ، نەوەک بچن بۆ وەرگرتنی عیلمەکەی ، وە ئەمەش لە بەرووبوومی عیلمەکەی بووە هیدایەت و ڕێنموونیەکەی و سەکینەت و دەرکەوتنی دیمەنی موسلمانەتیەکەی لە سیمای.

بۆیە جوان لەمە تێبگە وە تێکەڵ بە لە خوێندنی فیقهـ و فەرموودە بەهۆی خوێندنەوەی ژیانی سەلەف و زاهید بوونیان و وازهێنانیان لە دونیادا ، بۆ ئەوەی ئەمە بۆت ببێتە هۆکارێک بۆ نەرم بوونی دڵت .«

[ ( صيد الخاطر ( ٢٠٨ )]

20. حارث ی محاسبی ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت:

« کەسی ڕاستگۆ ئەو کەسەیە کە بەلایەوە گرنگ نییە ئەگەر هەموو قەدرو ڕێزو پلەو پایەیەکی لە دڵی گشت درووستکراوەکان بێتە دەرەوە لەپێناوی سەلامەتی و چاکی و باشی دڵی خۆی ، وە هەرگیز حەز ناکات کەوا خەڵکی بە ئەندازەی یەک میسقالە زەرە لەکاتی ئەنجام دانی کارو کردەوە چاکەکانی ببینێت ، وە ڕقیشی لەمە نابێتەوە کە خەڵکی ببینێت لەکاتی ئەنجام دانی کارو کردەوەی خراپی ، چونکە ڕق لێ بوونەوەی لەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا حەزدەکات زۆر خۆشەویست بێت لەلایان ، وە ئەمەش لە نیشانەکانی کەسانی ڕاستگۆ نییە.»

[ ( مدارج السالكين ( ٢/٢٦٦ )]

21. مەکحول ی شامی دەفەرموێت:

» نەرمترین و ناسکترین دڵ دڵی ئەو کەسانەیە ، کەوا خاوەنی کەمترین گوناه و تاوانن «
[ ( حلية الأولياء ) ( ١٨٠/٥ )]

## 22. عبدالله ی کوڕی موبارەک دەفەرموێت:

» دەزانم گوناه و تاوان دڵ دەمرێنێت
وە ئالوودەبوونیش پێیەوە زەلیلی و سەرشۆڕی لەدوای خۆی بەجێ دەهێڵێت
جا وازهێنان لە گوناه و تاوان ژیانە بۆ دڵ و دڵ زیندوو دەکاتەوە
جا باشتروایە سەرپێچی نەفست بکەیت کاتێ بەدوای ئارەزووەکان دەکەوێت.«
[ ( زاد المعاد ) ١٨٦/ ٤]

## 23. حوذەیفەی المرعشي دەفەرموێت:

« ئەگەر گوێڕایەڵی الله سبحانه وتعالى ت كرد لەكاتی نهێنی و پەنهانی و کاتێک لەچاوی خەڵکەوە دووریت ، ئەوا بتەوێت یان نەتەوێت دڵت چاک و سەلامەت دەبێت ».

[( صفوة الصفوة ( ٤/٢٧٠ )]

## 24. إبن ڕەجەب ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت:

« بنچینەی ئیستقامە بریتییە لە ئیستقامە و بەردەوام بوونی دڵ لەسەر تەوحید ، جا هەرکاتێک دڵ ئیستقامە و جێگیربوون و بەردەوامی هەبوو لەسەر ناسینی الله ، وە لەسەر ترسان لێی ، وە هەروەها بە گەورە و بە بەڕێز و بەشکۆ دانانی ، وە ترس و بیم لێی ، وە خۆشویستنی ، وە کارکردن بەوەی کە ئەو دەیەوێت ، وە بە ئومێد بوون لێی ، وە پاڕانەوە لێی ، وە پشت بەستن پێی ، وە پشت هەڵکردن لەهەموو پەرستراوێک بێجگە لەو نەبێت ، ئەوا ئەندامەکانی لاشەش هەر هەمووی ئیستقامەی دەبێت لەسەر گوێڕایەڵی کردنی ، چونکە دڵ پادشای ئەندامەکانی لاشەیە ، وە ئەندامەکانیش سەربازی ئەون ، جا ئەگەر پادشا ئیستقامەی

هەبوو ئەوا سەربازەکانی و ژێردەستەکانیشی ئیستقامەیان دەبێت .«

[ ( جامع العلوم والحكم ( ٣٨٦ )]

25. إبن تيمية ( ڕەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت:

» وە لە گەورەترینی هۆکارەکانی ئەم بەڵایە ( هۆگر بوون بە غەیری الله ) پشتهەڵکردن و دوورکەوتنەوەی دڵە لە الله تعالى ، چونکە ئەگەر دڵ تام و خۆشی عیبادەت و بەندایەتی کردن و ئیخڵاص و دڵسۆزی بۆ الله ی چەشت ، ئەوا هەرگیز شتێکی تر نادۆزێتەوە کە لەلایەوە شیرینتر و بە چێژتر و خۆشتر و پاکتر بێت لەمە.«

[ ( العبودية ( ٩٩ )]

26. إبن القيم ( ڕەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت:

» لە نیشانەکانی سەلامەتی دڵ:

• ئەوەیە کە کەمتەرخەم و سارد نابێت لە زیکر و یادی پەروەردگاری ، وە بێزار و بێتاقەت نابێت لە ماندوو بوون لە بەندایەتی کردنی ، وە دڵخۆش نابێت بە بێجگە لە الله ، تەنها بەکەسێک کە لەسەر ئەمە ڕێنمایی بکات و بۆی باس بکات و ئەم کارەی بەبیر بهێنێتەوە.

• وە لە نیشانەکانی سەلامەتی دڵ ە:

کەوا ئەگەر چووە ناو نوێژەکەی هەرچی غەم و پەژارەیە بۆ دونیا لەلای دەڕوات و نامێنێت ، وە سەختە لەلایەوە تەواو بوون لە نوێژەکەی و دەرچوون لێی ، چونکە ئاسوودەیی و خۆشیەکی زۆر لەناو نوێژەکەدا دەدۆزێتەوە ، وە دڵی خۆش و شادوومان دەبێت بە نوێژکردن.

• وە هەروەها لە نیشانەکانی سەلامەتی دڵ:

ئەوەیە کە گرنگی پێدانی بە ڕاست کردنەوەی کارو کردەوەکانی گەورەترە لەلای لە کردەوەکە ، جا سووردەبێت لەسەر ئیخلاص و نیەت پاکی تیایدا وە هەروەها سووردەبێت لەسەر ئامۆژگاری کردن و شوێنکەوتن و چاکە کردن ، وە لەگەڵ ئەمەشدا شایەتی

ئەوە دەدات كە ئەمە منەتی الله تعالى یە بەسەریەوە ، وە شایەتی دەدات لەسەر كەمتەرخەمی بوونی لە ئاست حەق و مافی الله سبحانە وتعالى .»

[ ( إغاثة اللهفان ( ١٢١ ]

*******************************************************

## { بەشی چوارەم دەربارەی : ناسینی نەفس }

1. پێشەوا أبو بەکری صدیق لە وەسیەتەکەی بۆ ئیمامی عومەر ( الله تعالى لە هەردووکیان ڕازی بێت ) کاتێک کردیە خەلیفە لەدوای خۆیەوە پێی فەرموو:

« یەکەم شت کە لێی ئاگادارت دەکەمەوە ئەو نەفس ـەتە کە کەوتووەتە نێوان هەردوو تەنیشتەکانت ».

[ ( جامع العلوم والحكم ( ٤٩٠ ) ]

2. ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب ( الله لێی ڕازی بێت ) دەفەرموێت:

« هیچ کەسێک نییە لە نەفسی ـدا کیبر و خۆبەگەورە زانین هەبێت ئەوا ئیللا زەلیلی و ڕیسوایی لەخۆیدا دەبینێتەوە ».

[ ( نهاية الأرب في فنون الأدب ( ٣٧١ ) ]

3.وە هەروەها ئیمامی عومەر ( الله لێی ڕازی بێت ) دەفەرموێت :

» دەستەوەسان و بێ دەسەڵات ئەو کەسەیە کە بێ دەسەڵات و دەستەوەسانە بەرامبەر نەفسی خۆی و ناتوانێت بە چاکی بەرێوەی ببات .«

[ ( أدب الدنیا والدین ) ( ٢١٠ )]

4.عبدالله ی کوڕی مەسعود ( الله لێی ڕازی بێت ) دەفەرموێت :

» بەڕاستی مرۆڤ هاندەرێکی فریشتەیی وە هاندەرێکی شەیتانی هەیە ، جا هاندانی فریشتەکە بریتییە لەوەی کە هانی دەدات بۆ ئەنجام دانی چاکە و بەڕاست دانانی حەق ، جا هەرکەسێک ئەوەی بینی و ( لە دڵیدا هەستی پێ کرد ) ئەوا با سوپاس و ستایشی الله لەسەر ئەمە بکات ، وە هەروەها هاندانی شەیتانیش بریتییە لەوەی کە هانی مرۆڤ دەدات بۆ ئەنجام دانی

خراپە و بە ناڕاست دانانی حەق ، جا هەرکەسێکیش ئەمەی بینی و ( لە دڵیدا هەستی پێ کرد ) ئەوا با پەنا بە الله بگرێت.»
[ ( الزهد لأبي داود ( ١٦٤ )]

5. أبو دەرداء ( الله لێی ڕازی بێت ) دەفەرموێت:

» خۆشەویستیت بۆ شتێک وات لێ دەکات کە کوێر بیت و کەڕ بیت لە ئاستیدا .«
[ ( الزهد لأبي داود ( ١٩٧ )]

6. عبدالله ی کوڕی مەسعود ( الله لێی ڕازی بێت ) دەفەرموێت :

» والله ئەوەی کە من دەیزانم لەوەی کە لە نەفسـ مدا هەیە ئەگەر ئێوە بتانزانیبوایە ئەوا بە مشت خۆڵتان ئەکرد بەسەر سەرمدا .«
[ ( الزهد لأبي داود ( ١٤٤ )]

7. عبدالله ی کوڕی موبارەک ( رەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت:

« زۆربەی خەڵکی قسەیان دەربارەی ئەدەب کردووە ، وە ئێمەش دەڵێین : ئەدەب بریتییە لە ناسینی نەفس و نەزانی و کەمتەرخەمیەکەی ، وە هەروەها دوور کەوتنەوە لەم نەزانی و کەمتەرخەمیانە .»

[ ( الرسالة القشيرية ( ٢/٤٤٨ ) ]

8. هەروەها عبدالله ی کوڕی موبارەک ( رەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت:

« لە گەورەترینی بەڵا و موسیبەتەکان بۆ پیاو ئەوەیە کە : بزانێت لە نەفسیدا کەمتەرخەمی هەیە ( بەرامبەر عیبادەت و گوێڕایەڵی کردنی الله تعالى ) پاشان گرنگی پێ نەدات و هیچ دڵتەنگیش نەبێت بۆی.» !

[ ( شعب الإيمان ( ٢/٢٧١ ) ]

9. سوفیانی ثەوری ( رەحمەتی اللە لێی بێت ) دەفەرموێت:

» دەگوترێت : ئەگەربەچاکی نەفسی خۆت ناسی ئەوا هیچ شتێک زیانت پێ ناگەیەنێت لەو قسانەی کە دەربارەت دەگوترێت.«

[ ( الزهد لابن المبارك ( ٢/١٤ )]

10. حەسەنی بەصری ( رەحمەتی اللە لێی بێت ) دەفەرموێت:

» ئەگەر نەفست بۆ حەق بەکاری نەهێنی و سەرقاڵی نەکەیت بۆ حەق ئەوا لەبەرامبەردا ئەو بۆ باطل و ناحەق بەکارت دەهێنێ و پێیەوە سەرقاڵت دەکات .«

[ ( المجالسة وجواهر العلم ( ٧/٧٣ )]

11. سەهل ی کوڕی عبداللە التُّستري دەفەرموێت:

» ناسینی نەفس شاراوەترە لە ناسینی دوژمن ، وە هەروەها ناسینی دوژمن یش دیارترە لە ناسینی دونیا .«

[ ( حلية الأولياء ( ١٠/٢٠١ )]

12. ئیمامی أحمد ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت:

« کاتێک بە سوفیانی ثەوری دەگوترا : کە لە خەودا بینراوە ، ئەوا دەیفەرموو : من خۆم زاناترم بە نەفسی خۆم لەو کەسانەی کە خەون دەبینن ( واتە : لەگەڵ ئەو عیبادەت و وەرعەشی کە هەیبووە ئینجا هەر خۆشی پێ کەمتەرخەم بووە) ».

[ ( سير أعلام النبلاء ) ٧/٢٥٢ ]

13. وەهیب ی کوڕی الورد ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت :

« نەفسی خۆم چاک کرد بەهۆی ناسینی خراپیەکانی ، وە بەسە بۆ مرۆڤ کە خراپ بێت لەبەرئەوەی دەزانێت لە نەفسیدا خراپە هەیە پاشانیش هەر بەردەوامە لەسەری ».

[ ( المجالس للدينوري ) ٥/١٤٦ ]

14. عاصم ی الأحول ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت:

» با خەڵکی بێ ئاگات نەکەن و سەرقاڵت نەکەن لە نەفسی خۆت ، چونکە کارەکە هەر بەخۆت دەگات بەبێ ئەوان ( واتە : کاتێک لێپرسینەوەت لەگەڵ دەکرێت تۆ تەنهایت ، وە ئەوان ناتوانن هیچ سوودێکت پێ بگەیەنن).«
[ ( الزهد لابن المبارك ( ٢/١٨ )]

15. ئیبراهیم ی کوڕی ئەدهەم ( رەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت:

» هەرکەسێک نەفسی خۆی ناسی ئەوا سەرقاڵ دەبێت بە نەفسی خۆیەوە ، وە هەرکەسێکیش پەروەردگاری ناسی ئەوا بە پەروەردگاری خۆیەوە سەرقاڵ دەبێت وە دوور دەکەوێتەوە لە غەیری ئەو .«
[ ( حلية الأولياء ( ٨/١٥ )]

16. وە هەندێک لە قسەزان و داناکان دەفەرموون:

» هەرکەسێک توانای بەسەر نەفسی خۆیدا هەبێت دەگاتە ئەو پەڕی بەهێزی ، وە هەرکەسێک ئارام بگرێت لە بەرامبەر شەهوەت و ئارەزووی خۆیدا دەگاتە لووتکە لە شەخسیەت و کەسایەتیدا ، جا ئەوکات نەفسی خۆی دەگرێت کاتێک دەزانێت چی حەشار داوە بۆی ، بەهۆیەوە لاری و خواریەکەی ڕاست دەکاتەوە و خراپیەکەشی چاک دەکات.«
[ ( أدب الدنیا والدین ( ٢١١ ]

## 17. لە ئەیوب ی سەختیانی ەوە ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت:

» بە عومەری کوڕی عبد العزیز گوترا : ئەی ئەمیری ئیمانداران بۆ نایەیتە مەدینە چونکە ئەگەر لەوێ وەفات بکەی ئەوا لە گۆڕی چوارەم لەگەڵ رسول الله ( صلی الله علیه وسلم ) لەو شوێنە دەنێژرێیت ، ئەویش فەرمووی : والله ئەگەر الله تعالی بەهەرشتێک بیەوێت سزام بدات تەنها بە ئاگر نەبێت ئەوا لەلام

خۆشترە لەوەی کە بزانێت لە دڵمدا پێم وایە من بۆ ئەم شوێنە شیاوم. »
[ ( المعرفة والتاريخ ( ١/٦٠٧ ) ]

**وصلى الله وسلم وبارك على عبده ورسوله نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين ، والحمد لله رب العالمين.**